# ناسنامەی کتێب

---

ناوی کتێب : بەچی نیەت و مەبەستێك قورئان بخوێنمەوە ؟

نوسین و ئامادەکردنی : محمد عبدالرحمن

دیزاین : ئـلراس بکر

(١٤٤٣) کۆچی

---

# پێشەکی

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ، وَصَلَّى اللَّهُ عَلَى أَشْرَفِ الْمُرْسَلِينَ ، نَبِيِّنَا مُحَمَّدٍ ﷺ، وَعَلَى آلِهِ وَصَحْبِهِ وَمَنْ اتَّبَعَهُ بِإِحْسَانٍ إِلَى يَوْمِ الدِّينِ ، أَمَّا بَعْدُ:

ئاشکرایە لە سەردەمێکدا دەژین کە فیتنە و فەساد و خراپەکاری باڵی کێشاوە بەسەر زۆرینەی شوێن و زۆرینەی بیر و فکرەکان و گەیشتۆتە هەموو شوێنێك و هەموو ماڵێك و هەموو بیر و فیکرێك الا ما رحم الله ، هەوەك اللهﷻ فەرموویەتی: ﴿ظَهَرَ ٱلْفَسَادُ فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِى ٱلنَّاسِ لِيُذِيقَهُم بَعْضَ ٱلَّذِى عَمِلُوا۟ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ﴾. الروم : [٤١]

واتە : فەساد و خراپەکاری لە وشکانی و لە دەریادا بەدیارکەوت ، بەهۆی تاوان و گوناهی خەڵکەوە ، با هەندێك تاڵاوی کردەوەکانیان پێ بچێژێت ، بەڵکو بە هۆش خۆیان بێنەوە و پەشیمان ببنەوە و بگەڕێنەوە لای اللهﷻ.

بۆیە بزانە ڕەحمەتی الله ﷻت لێبێت ، چارەسەر و دەرمانی دەردەکان تەنها و تەنها گەڕانەوەیە بۆ لای الله ﷻو چێژ وەرگرتن لە کلام و وتەی الله کە قورئانە ، هەروەها ئەوەی لێرە کە بمهەوێت دەربارەی بدوێم ، ئەوەیە کە زۆرینەی موسڵمانان قورئان ناخوێننەوە تەنها بە نیەت و مەبەستی پاداشت و خێر نەبێت ،

زۆرینەی نیەت و مەبەستیان تەنها ئەوەیە بە خوێندنەوەی قورئان چەند خێریان بۆ دەنوسرێت ؟ وە چەند پاداشت بە دەست دەهێنن ؟ ئەوەش گەورەترین غەفڵەت و پشت هەڵکردنە لە سوود و بەرەکەت و نیعمەتەکانی قورئانی پیرۆز ، پێویستە لەسەر کەسی یەکخواپەرست و موسڵمان کە هەوڵ و تێکۆشانی هەبێت و هەوڵ بدات بۆ تێگەیشتن لە قورئان لە کاتی خوێندنەوەیدا ،



بۆ ئەوەی خوێندنەوەمان تەنها تەواوکردن و خەتم کردن نەبێت ، چونکە زۆرینەمان وا فێربووین کە خوێندنەوەی قورئان بریتیە لە خەتم کردنی و بیر کردنەوە لە خێرەکەی بە بێ هیچ مەبەستێکی تر ،بۆیە زۆرینەمان دوورین لە تێگەیشتنی مەبەست و نیازی کەلامی الله ﷻو لێی تێناگەین و کاری پێ ناکەین و ڕەنگدانەوەی نییە لە خودی خۆمان و دەوروبەریشمان ، هۆکارەکەی هەمووی دوور بوونە لە حەقیەتی مانا و ناوەڕۆکی قورئان و تێنەگەیشتن لێی ، بۆیە باش بزانە ڕەحمەتی الله ﷻت لێبێت ، قورئان مەنهەج و ژیان و بەرنامەیە ، یەکەم کەس بە بیر نەفسی تاوانکاری خۆمی دەهێنمەوە و پاشان ئەونوسراوەش یەکەم کەس بۆ خودی نەفسی خۆمە پاشان بۆ کەسی خوێنەر ، وە بە بیر خۆم و ئێوەش دەهێنمەوە کە لە کاتی خوێندنەوەی کەلام و فەرمایشتی الله ﷻ، موسڵمان پێویستە بەو نیەت و مەبەستە قورئان و کەلامی الله ﷻبخوێنێتەوە بە ئومێدی ئەوەی الله ﷻڕەحممان پێ بکات و لێمان خۆشبێت و پلەو پایەمان بەرز بکاتەوە.

وە بێگومان لە کاتی ئەنجامدانی هەر عیبادەتێك پێویستە نیەتمان پاك بکەینەوە بۆ الله ﷻ و نیەت و مەبەستمان تەنها و تەنها بۆ الله ﷻ بێت بە بێ هیچ مەبەستێکی تر ، چونکە بەڕاستی هەبوونی مەبەست و نیاز بۆ جگە لە الله ﷻتۆزی با بردوویە و الله ﷻ قبوڵی ناکات ، هەروەك رسول الله ﷺ فەرموویەتی: (إِنَّمَا الْأَعْمَالُ بِالنِّيَّةِ وَإِنَّمَا لِامْرِئٍ مَا نَوَى..) رواه البخاري

واتە : هەموو کار و کردەوەیەك بە نیەت و نیاز و مەبەستە و هەموو کەسێك بە نیاز ومەبەستی خۆی دەگات - چی باش بێت یان خراپ. لێرەوەش ئەڵێم یا الله دڵ و نیەت و مەبەستمان پاك بکەیتەوە و کار و کردەوەمان تەنها بۆ وجە و ڕەزامەندی زاتی تۆ بێت سبحانە وتعالی ، بێگومان الله ﷻفەرمانی پێمان کردووە دڵسۆز و نیەت پاك بین لە عیبادەت و کار و کردەوەکانمان تەنها و تەنها لەبەر الله ﷻبێت ، هەروەك فەرموویەتی: ﴿وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ وَيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُواْ ٱلزَّكَوٰةَۚ وَذَٰلِكَ دِينُ ٱلۡقَيِّمَةِ﴾ سورەتی البينة [٥]

واتە : فەرمانیشیان پێنەدرابوو جگە بەوەی کە الله پەرستی بکەن و بە پاکی و دڵسۆزی و ملکەچی فەرمانبەرداری ئاین و بەرنامەکە بن و لابدەن لە هەموو ئاینێك و ڕێبازێك جگە لە ئیسلام و تەنها پابەندی ئیسلام بن ، نوێژیش بەڕێك و پێکی ئەنجام بدەن ، زەکاتیش لە ماڵ و سامانیان دەربکەن ، ئەوەیە ئاینی نامە ڕاست و بەنرخەکانی الله یە.



## خوێندنەوەی قورئان و نەزانینی تەفسیرەکەی!

قال أبو جعفر الطبري رحمه الله : (إني أعجب ممن قرأ القرآن ولم يعلم تأويله كيف يتلذ بقراءته؟!)[1]

واتە : پێشەوا طەبەری رحمە اللە فەرموویەتی: (من سەیرم لەو کەسە دێت کە قورئان دەخوێنێتەوە و تەفسیرەکەی نازانێت چۆن چێژ لە خوێندنەوەی وەردەگرێت ؟ !)

قال سعيد بن جبير رحمه الله : (من قرأ القرآن، ثم لم يفسره، كان كالأعمى أو كالأعرابي)[2].

واتە : پێشەوا سعید ی کوڕی جبیر رحمە اللە فەموویەتی: (هەرکەسێك قورئان بخوێنێتەوە ، پاشان تەفسیری نەکات و نەیزانێت وەك نابینا یان وەک کەسێکی نەزان وایە).

بۆیە ڕەحمەتی اللە ﷻلێبێت ، بزانە خوێندنەوە قورئان بە بێ زانینی ماناکەی ، بەڕاستی وەك کەسێکی نابینا و کوێر و نەزان وایە ، بۆیە پێویستە قورئان بخوێنینەوە بۆ ئەوەی لێی تێبگەین ، پاشان کردەوەی پێ بکەین بە ئومێدی ئەوەی بگەینە ڕیزی صاڵح و چاکەکارانەوە.

[1] سەرچاوە: معجم الأدباء لياقوت الحموي: (٢٤٥٣).

[2] سەرچاوە: تفسير الطبري : (١ / ٨١)

## بەچی شێوازێك قورئان بخوێنمەوە ؟

قال سلم الخواص رحمه الله: ( كنت أقرأ القرآن ولا أجد له حلاوة ، فقلت لنفسي : اقرئيه كأنك سمعتيه من رسول الله صلى الله عليه وسلم، فجاءت حلاوة قليلة ..فقلت لنفسي : اقرئيه كأنك سمعتيه من جبريل عليه السلام حين يخبر به النبي صلى الله عليه وسلم قال: فازدادت الحلاوة ...ثم قلت لها : اقرئيه كأنك سمعتيه حين تكلم به ، قال :فازدادت الحلاوة كلها )[1]..

واتە: پێشەوا سلم الخواص رحمه الله فەرموویەتی: (من قورئانم دەخوێندەوە و تام و چێژم لێ نەدەبینی ، بۆیە بە خۆمم گوت : بەو شێوەیە بیخوێنەوە وەکو ئەوەی لە رسول اللهﷺت بیستبێت ، جا کەمێک تام و چێژی زیار دەبوو ، دواتر بەخۆمم وت : بەو شێوەیە بیخوێنەوە وەکو ئەوەی لە جبریل علیه السلام ەوە بیستبێتت کاتێک بە رسول الله ی ﷺدەگوت ، جا تام و چێژی زیاتر دەبوو ، دواتر گوتم : بەو شێوەیە بیخوێنەوە وەکو ئەوەی گوێت لە الله ﷻبێت کاتێك فەرموویەتی).

فەرمووی : تام و چێژم لە هەمووی دەکرد و تام و چێژم بۆی زیادی دەکرد.

يقول ابن القيم رحمه الله : ( إذا أردت الانتفاع بالقرآن : فاجمع قلبك عن تلاوته وسماعه ، وألق سمعك ، واحضر حضور من يخاطبه به من تكلم به سبحانه ، منه إليه ، فإنه خطاب منه سبحانه إليك )[2].

واتە : پێشەوا ابن القيم رحمه الله فەرموویەتی : گەر ویستت سوود لە قورئان وەربگریت :

ئەوە دڵت کۆبکەرەوە لە کاتی خوێندنەوە و گوێگرتن لێی ، وە باش گوێی بۆ بگرە وە بەو شێوەیە ئامادە بە بۆی کە وەکو ئەوەی ڕاستەخۆ الله ﷻمەبەستی تۆ بێت لە فەرمایشتەکە.

[1] سەرچاوە: حلية الأولياء

[2] سەرچاوە: الفوائد ص ١

## گرنگی دان بە قورئان چۆنە ؟

رأى عبد الله بن مسعود رضي الله عنه مصحفاً قد زُين بالذهب ، فقال: (إن أحسن ما زُين به المصحف : تلاوته في الحق)[1].

واتە : پێشەوا عبداللە کوڕی مەسعود مصحفێکی بینی بە ئاڵتون ڕازێندرابوو ، فەرمووی: (باشترین شت مصحفی پێ برازێندرێتەوە : خوێندنەوەیەتی بە حەق).

واتە بە شێوازێك قورئان بخوێنەوە کە حەقی پێ بدەیت و سنوورەکانی بپارێزیت و کار و کردەوە بەوە بکەیت کە دەیخوێنیتەوە.

سەرچاوە: [1] مصنف ابن أبي شيبة

# بەچی نیەت و مەبەستێك قورئان بخوێنمەوە ؟

**١- قورئان دەخوێنمەوە بە مەبەستی بەدەستهێنانی علم و زانست و كردەوە پێكردنی** ، چونكە كردەوە پێكردن بە زانست هۆكارێكە لە هۆكارەكانی چوونە بەهەشت.

الله ﷻفەرموویەتی: ﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ﴾. البقرة |٨٢|

واتە : وە ئەوانەی كە ئیمان و باوەڕیان هێناوە و كردەوەی باشیان ئەنجام داوە ئا ئەوانە هاودەم و نیشتەجێی بەهەشتن تیایدا دەمێننەوە تا هەتایی.

قال ابن القيم رحمه الله : ( أهلُ القرآن ، هم العاملونَ به ، العاملونَ بما فيه، وإن لم يحفظوهُ عَن ظهرِ قَلب)[1].

واتە : پێشەوا ابن رحمه الله فەرموویەتی : ئەهل و هەڵگرانی قورئان ئەوانەن كە زانستیان پێی هەیە ، ئەوانەن كە كار و كردەوە دەكەن بەوەی كە لەناویدا هەیە ، ئەگەر چی لەبەریشیان نەبێت.

وعن سَهْلِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ يَقُولُ: (الْعِلْمُ كُلُّهُ دُنْيَا ، وَالْآخِرَةُ مِنْهُ الْعَمَلُ بِهِ )[2].

واتە : علم و زانست هەمووی دونیایە ، ئاخیرەتەكەشی كردەوە كردنە بەو علم و زانستە.

---

[1] سەرچاوە: زاد المعاد ١/٣٣٨

[2] سەرچاوە: اقتضاء العلم العمل



وقَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ الْمُعْتَزِّ: (عِلْمٌ بِلَا عَمَلٍ كَشَجَرَةٍ بِلَا ثَمَرَةٍ)[1].

واتە: زانستی بێ كردەوە ، وەك داری بێ بەرە.

وَقَالَ أَيْضًا: ( عِلْمُ الْمُنَافِقِ فِي قَوْلِهِ، وَعِلْمُ الْمُؤْمِنِ فِي عَمَلِهِ)[2].

هەروەها فەرموویەتی : علم و زانستی دووڕوو و مونافیق لە زمان و وتەكانیەتی ، علم و زانستی كەسی باوەڕداریش لە كردەوەكانی.

عبدالله بن مسعود رضي الله عنه: (أَيُّهَا النَّاسُ تَعَلَّمُوا فَمَنْ عَلِمَ..فَلْيَعْمَلْ)[3].

واتە : ئەی خەڵكینە فێربن ، فێری دین ببن هەركەس فێربوو ، با كار بكات بەوەی فێری بووە.

هەروەك گوتراوە:

وَكُلُّ مَـنْ بِغَيْـرِ عِـلْمٍ يَعْمَلُ

أَعْـمَـالُـهُ مَـرْدُودَةٌ لَا تُـقْبَلُ

واتە : هەر كەسێك بە بێ علم و زانست كار بكات ، كارەكانی ڕەددە و لێی وەرناگیرێت.

قال أبو الدرداء رضي الله عنه: [4]( ويل للذي لا يعلم مرة ، وويل للذي يعلم ثم لا يعمل سبع مرات).

واتە : پێشەوا أبو الدرداء رضي الله عنه فەرموویەتی : هاوار بۆ ئەو كەسەی نازانێت یەک جار ، وە هاوار بۆ ئەو كەسەی ئەزانێت بەڵام كاری پێناكات حەوت جار.



سەرچاوە: [1] اقتضاء العلم العمل

سەرچاوە: [2]اقتضاء العلم العمل

سەرچاوە: [3] أبو داود في الزهد١٦٦

سەرچاوە: [4]الزهد للإمام أحمد صـ ١٩٤



قال الإمام مالك ١٧٩ هـ ﷺ :( والإيمان قول وعمل ، ولا إيمان إلا بعمل ، ولا عمل إلا بإيمان)[١].

واتە : پێشەوا مالك رحمه الله فەرموویەتی : ئیمان وتە و كردارە ، ئیمان بوونی نییە مەگەر بە كردەوە نەبێت ، كردەوە بوونی نییە مەگەر بە ئیمانەوە نەبێت.

## ٢- قورئان دەخوێنمەوە بە مەبەستی هیدایەت و ڕێنموونی الله تعالی بۆ ڕزگار كردنی نەفسی خۆم و خێزان و منالْ و دەوروبەرم.

الله ﷻفەرموویەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَأَهۡلِيكُمۡ نَارٗا وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلۡحِجَارَةُ عَلَيۡهَا مَلَٰٓئِكَةٌ غِلَاظٞ شِدَادٞ لَّا يَعۡصُونَ ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمۡ وَيَفۡعَلُونَ مَا يُؤۡمَرُونَ﴾. التحريم [٦]

واتە : ئەی ئەوانەی كە باوەڕتان هێناوە خۆتان و كەس و كارتان بپارێزن لە ئاگرێك كە سووتەمەنییەكەی خەڵكی و بەردە ، چەند فریشتەیەكی دڵ ڕەق توند و تیژی وا كە بێ فەرمانی الله ﷻناكەن لەوەی كە فەرمانیان پێ بدات وە چ فەرمانێكیان پێ بدرێت دەیكەن.

الله ﷻفەرموویەتی : ﴿وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبۡ لَنَا مِنۡ أَزۡوَٰجِنَا وَذُرِّيَّٰتِنَا قُرَّةَ أَعۡيُنٖ وَٱجۡعَلۡنَا لِلۡمُتَّقِينَ إِمَامًا﴾ الفرقان [٧٤]

واتە : ئەوانەشن كە دەڵێن : پەروەردگارا لە هاوسەران و نەوەكانمان كەسانێكمان پێ ببەخشە كە ببنە مایەی ڕووناكی دیدەمان و شادمانی دڵەكانمان.



سەرچاوە: [1]الجامع في العقائد ص ١٧٨



حدثني يونس، قال: أخبرنا ابن وهب، قال: قال ابن زيد في قوله: ﴿وَالَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَاجِنَا وَذُرِّيَّاتِنَا قُرَّةَ أَعْيُنٍ﴾ قال :يسألون الله لأزواجهم وذرياتهم أن يهديهم للإسلام.

واتە : پێشەوا ابن زيد لە تەفسیری ئایەتی : ﴿وَالَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَاجِنَا وَذُرِّيَّاتِنَا قُرَّةَ أَعْيُنٍ﴾ فەرموویەتی : ئەوانەن كە داوا لە الله دەكەن هاوسەرەكانیان و منداڵەكانیان هیدایەت بدات بۆ ئیسلام .

## ٣- قورئان دەخوێنمەوە بە مەبەستی موناجات و گفتوگۆ كردن لەگەڵ الله.

الله ﷻفەرموویەتی: ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَتَطۡمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكۡرِ ٱللَّهِ أَلَا بِذِكۡرِ ٱللَّهِ تَطۡمَئِنُّ ٱلۡقُلُوبُ﴾ الرعد [٢٨]

واتە: ئەوانەی كە بڕوایان هێناوە و دڵیان ئارام دەبێت بە یادی الله ﷻئاگادار بن كە هەر بە یادی الله ﷻدڵەكان ئارام دەبن[٢].

## ٤- قورئان دەخوێنمەوە بە مەبەستی شیفا و چارەسەر لە نەخۆشیە ئاشكرا و ناوەكیەكان.

الله ﷻفەرموویەتی: ﴿وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلۡقُرۡءَانِ مَا هُوَ شِفَآءٞ وَرَحۡمَةٞ لِّلۡمُؤۡمِنِينَ وَلَا يَزِيدُ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا خَسَارٗا﴾. الإسراء:[٨].

واتە : ئێمە لە قورئان ئایەت و سورەتانێك دادەبەزێنین ، كە ببێتە هۆی شیفا و چارەسەر بۆ نەخۆشیە دەروونی و جەستەییەكان و نەخۆشی دڵ و گومرایی و سەرلێشێواوی ، هەروەها ڕەحمەت و میهرەبانیشە بۆ ئیمانداران ، بۆ ستەمكار و كافران و بێ باوەڕانیش تەنها زیادكردنی زەرەر و زیان نەبێت هیچی تر نییە ، هیچ بەهرە و سوودێكی لێ نابەن.



سەرچاوە: [١]تفسير الطبري

سەرچاوە: [٢]پوختەی تەفسیری قورئان



## ٥- قورئان دەخوێنمەوە بە مەبەستی ئەوەی کە الله دەرمبهێنێت لە زوڵم و تاریکی و شیرك و کوفر و نیفاق ، بەرەو ڕووناکی و نوور و هیدایەت و ئیمان.

الله ﷻفەرموویەتی: ﴿ٱللَّهُ وَلِيُّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ يُخْرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَوْلِيَآؤُهُمُ ٱلطَّٰغُوتُ يُخْرِجُونَهُم مِّنَ ٱلنُّورِ إِلَى ٱلظُّلُمَٰتِ أُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ﴾ البقرة [٢٥٧].

واته : هەر الله ﷻیار و یاوەری ئەو کەسانەیە کە باوەڕیان هێناوە ، چونکە لە هەموو ڕێبازە چەوت و تاریکستانەکانی کوفر و شیرك دەریاندێنێت و بەرەو نوور و ڕۆشنایی ئیسلامیان دەبات ، ئەوانەش کە کافر و بێ باوەڕن یار و یاوەریان هەر طاغوت و شەیطانە لە جن و ئادەمی ، لە ڕێبازی نوور و ڕووناکی دەریان دەهێنێت و بەرەو ڕێبازە تاریکستانەکان و کوفر و گومڕاییان دەبات ، ئەمانە دەبنە یار و یاوەری ئاگری دۆزەخ و بە هەتاهەتاییش تێیدا دەمێننەوە.

الله ﷻفەرموویەتی: ﴿ يَهْدِي بِهِ اللَّهُ مَنِ اتَّبَعَ رِضْوَانَهُ سُبُلَ السَّلَامِ وَيُخْرِجُهُم مِّنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ بِإِذْنِهِ وَيَهْدِيهِمْ إِلَىٰ صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ المَائدة : [١٦] .

واتە : بێگومان الله ﷻبە قورئان ڕێنمایی ئەو کەسە دەکات بۆ هەموو ڕێ و ڕێبازی هێمنی و سەلامەتی کە ئیسلامە ، شوێن ڕەزامەندی الله دەکەون ، وە بە فەرمانی خۆی لە گشت ڕێگە تاریکەکانی شیرك و کوفر دەریان دەهێنێت بۆ ڕووناکی ئیمان و بۆ ڕێباز و ڕێگای ڕاست ڕێنماییان دەکات.





**٦- قورئان دەخوێنمەوە بە مەبەستی عیلاج و چارەسەر بۆ دڵ ڕەق ، وە لە خوێندنەوەی ئارامی و هێمنی ئەدۆزمەوە و چونکە قورئان لابەری وەسوەسە و دوو دڵی و دڵتەنگیە.**

الله ﷻفەرموویەتی: ﴿أَفَمَن شَرَحَ اللَّهُ صَدْرَهُ لِلْإِسْلَامِ فَهُوَ عَلَىٰ نُورٍ مِّن رَّبِّهِ ۚ فَوَيْلٌ لِّلْقَاسِيَةِ قُلُوبُهُم مِّن ذِكْرِ اللَّهِ ۚ أُولَٰئِكَ فِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ﴾ الزُّمَر [٢٢] .

واتە : ئایا کەسێك الله ﷻدڵی بۆ ئیسلام گوشاد و ئاواڵە کردبێت و جێگەی ئیسلامی تێدا کردبێتەوە ، ئەوە ئەو کەسە لەسەر نور ڕووناکی پەروەردگاریەتی ، جا ئایا کەسێکی ئاوا ، وەکو ئەوکەسە وایە کە لە یادکردنی الله ﷻ دڵی رەق بوو بێت ، جا تیاچوون بۆ دڵڕەقەکان ، لە یادکردنی الله ﷻ، ئا ئەوانە لە گومڕاییەکی ئاشکرادان.

- وقال سهل بن عبدالله رحمه الله : ( كل عقوبة طهارة ، إلا عقوبة القلب فإنها قسوة )[١].

واتە : پێشەوا سهل ی کوڕی عبدالله رحمه الله فەرموویەتی : هەموو عقوبە و سزایەك پاکبوونەوەیە ، تەنها عقوبە و سزای دڵ نەبێت کە بریتە لە ڕەقبوونی دڵ.

- وقال ابن القيم رحمه الله : (ما ضُرب عبد بعقوبة أعظم من قسوة القلب والبعد عن الله.

وقال خلقت النار لإذابة القلوب القاسية. وقال أبعد القلوب من الله القلب القاسي)[٢].

واتە : پێشەوا ابن القیم رحمه الله فەرموویەتی : هیچ سزایەکی بەندە نەدراوە گەورەتر بێت لە سزای دڵ ڕەقبوون و دوور بوون لە الله.



سەرچاوە:[١](حلية الأولياء وطبقات الأصفياء لأبي نعيم 10/208 )

سەرچاوە: [٢]| الفوائد | [1/97]



وە فەرموویەتی : ئاگری دۆزەخ درووستکراوە بۆ دڵ ڕەقەکان

وە فەرموویەتی : دووترین دڵ لە الله ﷻ، دڵە ڕەقەکانە.

## ٧- قورئان دەخوێنمەوە بە مەبەستی نەهێشتن و لابردن و بەتاڵ بوونەوەی سیحر و حەسەدات و چاوەزار بۆ تووشبوونی خۆم و خێزان و دەوروبەرم.

الله ﷻفەرموویەتی: ﴿ فَلَمَّا أَلْقَوْا قَالَ مُوسَىٰ مَا جِئْتُم بِهِ السِّحْرُ ۖ إِنَّ اللَّهَ سَيُبْطِلُهُ ۖ إِنَّ اللَّهَ لَا يُصْلِحُ عَمَلَ الْمُفْسِدِينَ﴾ يُونس:[٨١]

واتە : ئینجا ئەوی کە مەبەستیان بوو بیهاوێژن ، هاویشتیان ، موسا علیه السلام وتی : دڵنیابن هەرچیتان هێنا جادوو بوو ، بشزانن کە بەڕاستی الله ﷻبەزوویی باتڵ و پووچەڵی دەکات ، چونکە هەرگیز الله ﷻکار و کردەوەی خراپەکاران ڕاست ناهێنێت و بە ئەنجامی ناگەیەنێت.

وأخْرَجَ ابْنُ أبِي شَيْبَةَ، وابْنُ جَرِيرٍ، وابْنُ مَرْدُويَهَ عَنِ ابْنِ عَبّاسٍ في قَوْلِهِ :﴿الوَسْواسِ الخَنّاسِ﴾

قالَ: ( الشَّيْطانُ جاثِمٌ عَلى قَلْبِ ابْنِ آدَمَ فَإنْ سَها وغَفَلَ وسْوَسَ وإذا ذَكَرَ اللَّهَ خَنَسَ)[1].

واتە : پێشەوا ابن عباس رضي الله عنه لە تەفسیری ئایەتی :﴿الوَسْواسِ الخَنّاسِ﴾ فەرموویەتی : شەیطانێکی نیشتەجێبووە لەسەر دڵی بەنی ئادەم ، ئەگەر لەبیری کرد و لێی بێ ئاگا بوو تووشی وەسوەسە و دوو دڵی دەکات ، وە ئەگەر زیکر و یادی الله ﷻی کرد دوور دەکەوێتەوە.



سەرچاوە: [1]( تفسير الدر المنثور).



## ٨- قورئان دەخوێنمەوە بە مەبەستی ئەوەی کە لە ڕیزی غافڵ و بێئاگایان نەنوسرێم و بەڵکو لە ڕیزی ئەو کەسانە بنوسرێم کە زۆر یادی الله دەکەن.

الله ﷻ فەرموویەتی: ﴿يَعْلَمُونَ ظَاهِرًا مِنَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَهُمْ عَنِ الآخِرَةِ هُمْ غَافِلُونَ﴾.

واتە: ( تەنیا لە ڕواڵەتی ئەم ژیان و ئەم دونیایە شارەزان بەڵام بێئاگان لە ڕۆژی دوای).

فقال الحسن البصري رحمه الله : [1](والله لبلغ من علم أحدهم من دنياه أنه يقلب الدرهم على ظفره يخبرك بوزنه، ما يحسن يصلي).

واتە : پێشەوا حسن ی بەصرِی رحمه الله لە تەفسیری ئەم ئایەتە فەرموویەتی : سوێند بە الله هەر یەکێکیان لە ژیانیدا گەیشتۆتە ئەو ئاستەی گەر درهەمێك بخاتە سەر نینۆکی هەواڵت ئەداتێ بە کێشەکەی !بەڵام نازانێت نوێژەکەی بە جوانی بکات!..

قال ابن القيم رحمه الله : (خراب القلب من الأمن والغفلة)[2].

واتە : پێشەوا ابن القيم رحمه الله فەرموویەتی : وێرانبوونی دڵ لە بێئاگاییەوەیە.



سەرچاوە: [1](تفسير ابن كثير).

سەرچاوە:[2]( كتاب الفوائد ).



## ٩- قورئان دەخوێنمەوە بە مەبەستی زیادبوونی ئیمان و یەقینم بە الله.

الله ﷻفەرموویەتی: ﴿ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴾. الأنفال: [٢]

واتە : باوەڕدارانی ڕاستەقینە و دڵسۆز هەر ئەوانەن کە هەر ناوی الله ﷻهێنرا ، دڵیان لەبەر گەورەیی ئەو دەکەوێتە لەرزە و ترسی لێدەنیشێت ، هەر کە ئایەتەکانیشی بەسەریاندا دەخوێندرێتەوە ، باوەڕیان زیاد و بەهێز دەبێت ، هەر بەپەروەردگاریشیان پشت دەبەستن و پشت و پەنایان هەر اللهﷻیە.

قال السُّدِّيّ في قَوْلِهِ : ﴿إِنَّما المُؤْمِنُونَ الَّذِينَ إذا ذُكِرَ اللَّهُ وجِلَتْ قُلُوبُهُمْ﴾

قالَ: ( هو الرَّجُلُ يُرِيدُ أنْ يَظْلِمَ أوْ يَهُمَّ بِمَعْصِيَةٍ فَيُقالُ لَهُ : اتَّقِ اللَّهَ، فَيَجِلُ قَلْبُهُ)[٢].

واتە : پێشەوا سودی لە تەفسیری ئایەتی: ﴿ إنَّما المُؤْمِنُونَ الَّذِينَ إذا ذُكِرَ اللَّهُ وجِلَتْ قُلُوبُهُمْ﴾

فەرموویەتی : ئا ئەو کەسەیە کە دەیەوێت زوڵم و ستەم بکات یان تاوانێك و خراپەیەك بکات ، جا پێی دەگوترێت :لە الله بترسە و تەقوای الله بکە !یەکسەر دڵی دەکەوێتە لەرزە و ترسی اللهﷻی لێ دەنیشێت.

## ١٠- قورئان دەخوێنمەوە بە مەبەستی ملکەچی بۆ فەرمانەکانی الله.

الله ﷻفەرموویەتی: ﴿ قُلْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَإِن تَوَلَّوْاْ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْكَٰفِرِينَ﴾. آل عمران [٣٢].

واتە : بڵێ ئەی پێغەمبەرﷺ : دەبێت گوێڕایەڵی الله و پێغەمبەرەکەی ﷺبن ، خۆ ئەگەر روویان وەرگێڕا و گوێرایەڵ نەبوون چاك بزانن کە کافر بوون و الله ﷻبێ باوەران و کافرانی خۆشناوێت.

حَدَّثَنا أبِي، ثَنا أبُو صالِحٍ، حَدَّثَنِي مُعاوِيَةُ بْنُ صالِحٍ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ أبِي طَلْحَةَ، عَنِ ابْنِ عَبّاسٍ ﴿فَإنْ تَوَلَّوْا﴾ يَعْنِي :الكُفّارَ تَوَلَّوْا عَنِ النَّبِيِّﷺ .

واتە : پێشەوا ابن عباس رضي الله عنه لە تەفسیری ئایەتی : ﴿فَإنْ تَوَلَّوْا﴾ فەرموویەتی : کافر و بێ باوەڕان پشت لە رسول الله ﷺدەکەن .



سەرچاوە:[١](الدر المنثور)

سەرچاوە:[٢](تفسير ابن ابي حاتم) [٣٤٠٧]

## ١١- قورئان دەخوێنمەوە بە مەبەستی خۆپاراستنم لە نیفاق و دوو ڕوویی.

 حَدَّثَنَا عَفَّانَ قَالَ : حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ زَيْدٍ قَالَ : حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ مَالِكٍ قَالَ : سَمِعْت أَبَا الْجَوْزَاءِ يَقُولُ: ( نَقْلُ الْحِجَارَةِ أَهْوَنُ عَلَى الْمُنَافِقِ مِنْ قِرَاءَةِ الْقُرْآنِ )[١].

واتە : پێشەوا أبا الجوزاء فەرموویەتی : گواستنەوەی بەرد ئاسانترە لە لای دووڕووەکان لە خوێندنەوەی قورئان.

## ١٢- قورئان دەخوێنمەوە بە مەبەستی بە دەستهێنانی شەفاعەتی قورئان لە ڕۆژی قیامەتدا.

 عن أبي أُمَامَةَ الْبَاهِلِي رضي الله عنه قَالَ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺيَقُولُ : (اقْرَءُوا الْقُرْآنَ فَإِنَّهُ يَأْتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ شَفِيعًا لأَصْحَابِهِ ). (رواه مسلم) ٨٠٤

واتە : قورئان بخوێننەوە چونکە بەڕاستی لە ڕۆژی قیامەت شەفاعەت بۆ خاوەن و خوێنەرەکەی دەکات.

## ١٣- قورئان دەخوێنمەوە بە مەبەستی تێگەیشتن لە حەرام و حەڵاڵ ، بۆ ئەوەی لەخۆمەوە حەڵاڵ حەرام نەکەم و حەرامیش حەڵاڵ نەکەم و ئەنجامی نەدەم ، بەڵکو بە بەڵگە بزانم چی حرامە و چی حەڵاڵە.

الله ﷻفەرموویەتی: ﴿ وَلَا تَقُولُوا لِمَا تَصِفُ أَلْسِنَتُكُمُ الْكَذِبَ هَٰذَا حَلَالٌ وَهَٰذَا حَرَامٌ لِّتَفْتَرُوا عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ ۚ إِنَّ الَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ لَا يُفْلِحُونَ﴾. النَّحْل : [١١٦]

واتە : وە بە زمان و سەر زارەکی و بێ بەڵگەی شەرعی ، لەخۆتانەوە هەندێ شت حەڵاڵ ، یان حەرام مەکەن و مەڵێن : ئەمە حەڵاڵە و ئەوە حەرامە ، ئێوە وەکو ئەو موشریکانە مەکەن کە بە ئارەزووی خۆیان حرام و حلاڵیان دەکرد ،



[١] سەرچاوە: (مصنف ابن أبي شيبة)



هەر بۆ ئەوەی لەسەر الله ﷻدرۆ هەڵبەستن !چونکە حەڵاڵ و حەرام بە دەستی ئێوە نییە و بۆتان نییە سنوور شکێنی بکەن ،بێگومان ئەوانەی کە درۆ بۆ الله ﷻو ئایینی الله ﷻهەڵدەبەستن ، سەرفراز و ڕزگار و بەختەوەر نابن.

الله ﷻفەرموویەتی: ﴿ قُلْ تَعَالَوْاْ أَتْلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمْ عَلَيْكُمْ أَلَّا تُشْرِكُواْ بِهِۦ شَيْـًٔا وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًا وَلَا تَقْتُلُوٓاْ أَوْلَٰدَكُم مِّنْ إِمْلَٰقٍ نَّحْنُ نَرْزُقُكُمْ وَإِيَّاهُمْ وَلَا تَقْرَبُواْ ٱلْفَوَٰحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ وَلَا تَقْتُلُواْ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِى حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ذَٰلِكُمْ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴾. الأنعام: [١٥١]

واتە : ئەی محمد ﷺبڵێ وەرن با بخوێنمەوە بۆتان ئەوەی پەروەردگارتان حەرامی کردووە لەسەرتان فەرمانی داوە کەوا هیچ شتێك نەکەن بە هاوبەش بۆی و لەگەڵ باوك و دایك دا ئاكار چاك و ڕەفتار جوان بن و منداڵەکانتان مەکوژن لەبەر هەژاری و نەبوونی ئێمە ڕۆزی ئێوەو ئەوانیش دەدەین وە نزیکی گوناھ مەکەونەوە ئەوەی کە ئاشکرا دەکرێت لەو تاوان و خراپانەشی کەوا بە نهێنی دەکرێت وە ئەو کەسە مەکوژن کە الله ﷻکوشتنی حەرام کردووە مەگەر حەق بێت ( بکوژرێتەوە لەجیات تۆڵەکردنەوە یان کەسێکی هەڵگەڕاوەتەوە لە دینەکەی)... الله ﷻئەمانەی بە ئێوە ڕاسپاردووە بۆ ئەوەی تێبگەن و ژیری خۆتان بەکاربهێنن.

## ١٤- قورئان دەخوێنمەوە بە مەبەستی بە جێگەیاندنی وەسیەت و فەرمایشتی رسول الله ﷺ، کاتێك کە فەرموویەتی : قورئان بخوێننەوە.

## ١٥- قورئان دەخوێنمەوە بە مەبەستی ئەوەی کە لە پشت هەڵکەران نەبم و لە قیامەت بە کوێری حەشر نەکرێم.

الله ﷻفەرموویەتی: ﴿وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنكًا وَنَحْشُرُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَعْمَىٰ﴾. طه: [١٢٤]





واتە : وە هەر کەسێکیش لەو قورئان و کەلامەم ڕوو وەربگێڕێت ، ئەوە بێگومان ژیانێکی سەختی دەبێت ، هەر چەند خاوەنی دونیاش بێت ، بەڵێ مرۆڤ هەر کە پەیوەندی لە الله ﷻبچڕا دڵی تەنگە ، بچووکە ، بێ ئارامە ، وە لە ڕۆژی قیامەتیشدا بە کوێری حەشر و دادگایی دەکەین.

الله ﷻفەرموویەتی: ﴿ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِ ءَايَٰتُنَا وَلَّىٰ مُسْتَكْبِرًا كَأَن لَّمْ يَسْمَعْهَا كَأَنَّ فِىٓ أُذُنَيْهِ وَقْرًا فَبَشِّرْهُ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴾. لقمان: [٧]

واتە : هەر کاتێکیش کە ئایەتەکانی ئێمەی بەسەردا دەخوێنرێتەوە ، فیز دەکات و فوو دەکاتە خۆی و پشت هەڵدەکات و حۆی بە گەورە دەزانێت ، هەروەک نەیبیستبێت ، هەروەك لە گوێیدا قورسی و گرانی هەبێت ، کەوابوو ئەی محمد ﷺمژدە بدە بەو جۆرە کەسانە بەوەی سزای بە ئێش چاوەڕێیانە!..

## ١٦- قورئان دەخوێنمەوە بە مەبەستی ئەوەی کە ئەمر بە چاکە بکەم و نەهی لە خراپە بکەم و فێری بم.

الله ﷻفەرموویەتی: ﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ ﴾. آل عِمرَان: [١١٠]

واتە : بەڕاستی ئێوە چاکترین ئوممەتێکن کە بۆ سوودی خەڵکی هێنراونەتە مەیدانەوە، چونکە فەرمان بە تەوحید و یەکخواپەرستی و چاکە دەکەن و قەدەغەی شیرك و کوفر و خراپە دەکەن و باوەڕی دامەزراوتان بە الله ﷻ هەیە و بە تاك و تەنها دەیپەرستن.





 وسئل ابن المبارك أيُّ الأعمال أفضل؟ قال: (النصح لله)[1].

واتە : پرسیار لە پێشەوا ابن مبارك كرا كام كردەوە باشترین و گەورەترینە ؟ فەرمووی: (ئامۆژگاری كردن لەبەر الله)، (سئل حذيفة رضي الله عنه عن ميت الأحياء فقال ) : الذي لا ينكر المنكر بيده ولا بلسانه ولا بقلبه).

واتە : پرسیار لە پێشەوا حذیفە كرا رضي الله عنه دەربارەی مردنی زیندووەكان ، فەرمووی : ئەو كەسەی كە ڕێگری ناكات لە خراپە بە دەستی و بە زمانی و بە دڵی.

## ١٧- قورئان دەخوێنمەوە بە مەبەستی ئەوەی كە الله پلە و پایەم بەرز بكاتەوە و سوودم پێ بگەیەنێت

، بەرز ببمەوە لە پلەكانی بەهەشت ، هەروەك رسول الله ﷺفەرموویەتی: (اقرأ وارتق ورتل ، واتە : قورئان بخوێنەوە و بەرز بەوە لە پلەكانی بەهەشت و بخوێنەوە وەك چۆن لە دونیا ئەتخوێندەوە).

الله ﷻفەرموویەتی: ﴿يَرْفَعِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنكُمْ وَٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ دَرَجَٰتٍ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ﴾. المجادلة: [١١]

واتە : ئەوانەی ئیمانیان هێناوە لە ئێوە و ئەوانەشتان زانست و زانیاریان پێدراوە چەندەها پلەو پایە بەرزیان دەكاتەوە ، الله ﷻئاگادارە بەو كار و كردەوانەی كە ئەنجامی دەدەن.

## ١٨- قورئان دەخوێنمەوە بە مەبەستی بەرجەستە كردن و پۆشینی ڕەوشت جوانی ،

چونكە ڕەوشت جوانی سیفەتی هەموو پێغەمبەرانە عليهم السلام ، وە سیفەتی هەموو پیاو چاكانە.

قالَ رَسولُ اللَّهِ ﷺ : (إنَّ مِن أخْيَرِكُمْ أحْسَنَكُمْ خُلُقًا). رواه البخاري

واتە : رَسولُ الله ﷺفەرموویەتی : باشترینتان ئەوانەن كە جوانترین ڕەوشتی هەیە.



سەرچاوە: ١(الأمر بالمعروف والنهي عن المنكر لابن أبي الدنيا ص١٠٧ )

سەرچاوە: ٢( رواه البيهقي في شعب الإيمان ٧١٨٤ )



**١٩- قورئان دەخوێنمەوە بە مەبەستی یاد و زیکری اللە و داو اکردنی بەردەوامی لەسەری** ، هەروەك لە فەرموودەیەکی قودسی هاتووە رسول اللە ﷺفەرموویەتی : اللە ﷻفەرموویەتی: (وَأَنَا مَعَهُ حِينَ يَذْكُرُنِي). متَّفقٌ عليهِ. واتە : من لەگەڵیم لە کاتێکدا یادم دەکات.

**٢٠- قورئان دەخوێنمەوە بە مەبەستی ئەوەی کە ببمە هەڵگری قورئان و ڕایەی ئیمان و یەکخو اپەرستی و تێکۆشەر بۆ ئیمان و ئیسلامەتی.**

اللە ﷻفەرموویەتی: ﴿ إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَيَوْمَ يَقُومُ ٱلْأَشْهَٰدُ﴾. غافر: [٥١]

واتە : بەڕاستی ئێمە پێغەمبەرەکانمان و ئەوانەش کە باوەڕیان هێناوە سەریان دەخەین لە ژیانی دنیادا ، هەروەها ئەو ڕۆژەش کە شاهێدەکان شاهێدی دەدەن (فریشتەکان شایەتی بۆ پێغەمبەران دەدەن ، پێغەمبەران شایەتی بۆ بانگخوازان دەدەن بانگخوازان شایەتن لەسەر خەڵکی).

**٢١- قورئان دەخوێنمەوە بە مەبەستی ڕزگاربوونم و بەدەم چوونی بانگەوازی سەرفرازی و سەلامەتی و ڕزگاری** ، کە ڕزگارکەر و پارێزەرە بۆم لە ئاگر و لە سزا و عەزابی اللە ﷻبۆ ئەوەی لە هاوەڵانی دۆزەخ نەبم.

اللە ﷻفەرموویەتی: ﴿ وَيَا قَوْمِ مَا لِي أَدْعُوكُمْ إِلَى النَّجَاةِ وَتَدْعُونَنِي إِلَى النَّارِ﴾. غَافِر: [٤١]

واتە : ئەی قەوم و هۆزەکەم !چی هەیە بۆ ئێوە من بانگتان دەکەم بۆ ڕزگاری و سەرفراز بوون و کە بەهەشتە ، ئێوە بانگی من دەکەن بۆ ئاگری دۆزەخ؟ !

اللە ﷻفەرموویەتی:﴿وَمِنْهُم مَّن يَقُولُ رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الْآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ﴾.البَقَرَة: [٢١]

واتە : لەوان هەیە دەڵێت ئەی پەروەردگاری ئێمە !داوات لێدەکەین لە دونیادا خێر و چاکەمان پێ ببەخشە ، هەم لە دوا ڕۆژیشدا ناز و نیعمەتمان پێ ببەخشیت ، وە لە سزای ئاگریش بمانپارێزە.

اللە ﷻفەرموویەتی: ﴿الَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا إِنَّنَا آمَنَّا فَاغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ﴾. آل عِمرَان: [١٦]





واتە : ئەی پەروەردگارمان !بێگومان ئێمە باوەڕمان بە تۆ و بە پێغەمبەرانت هەیە ، یا الله تۆش بە بەزەیی خۆت لە گوناهەکانمان خۆشبە و لە سزای ئاگریش بمانپارێزە.

الله ﷻفەرموویەتی: ﴿وَاتَّقُوا النَّارَ الَّتِي أُعِدَّتْ لِلْكَافِرِينَ ﴾. آل عِمرَان: [١٣١]

واتە : خۆتان بپارێزن لەو ئاگرەی کە بۆ کافر و بێ باوەڕان ئامادەکراوە.

## ٢٢. قورئان دەخوێنمەوە بە مەبەستی ئەوەی کە لە قیامەتدا هیچ شتێك سوودم پێ ناگەیەنێت تەنها کار و کردەوە چاکەکانم نەبێت کە لە دونیا ئەنجامم داوە و بەرهەمەکەی ئەبینمەوە لە قیامەتدا.

الله ﷻفەرموویەتی: ﴿ يَوْمَ لَا يَنفَعُ مَالٌ وَلَا بَنُونَ إِلَّا مَنْ أَتَى اللَّهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ﴾ الشُّعَرَاء: [ ٨٨ – ٨٩]

واتە : ئەو ڕۆژە کە ، نە ماڵ سوودی هەیە ، نە منداڵ بە کەڵك دێن ، مەگەر کەسێك کە بە دڵێکی ساغ و سەلامەتەوە بگەڕێتەوە لای الله ﷻ، ساغ بووبێت لە نەخۆشی شیرك و نیفاق و دووڕوویی ، خۆیشی تەنها بە الله ﷻ پەیوەست کردبێت و هەر لەگەڵ بەرنامەی ئەودا بووبێت ، وە لە مانای ) لا إله إلا الله ( شارەزا بووبێت و للمی پێی هەبووبێت.

 وأخْرَجَ عَبْدُ الرَّزّاقِ، وعَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، وابْنُ جَرِيرٍ، عَنْ قَتادَةَ في قَوْلِهِ :﴿إلا مَن أتى اللَّهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ﴾

قالَ: كانَ يُقالُ :سَلِيمٌ مِنَ الشِّرْكِ.



---

سەرچاوە: [١](تفسير الدر المنثور).



واتە : پێشەوا قەتتادە لە تەفسیری ئایەتی : ﴿إلا مَن أتى اللَّهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ﴾ ، فەرموویەتی : سەلیم و پارێزراو بێت لە شیرك و هاوەڵ بڕیاردان.

اللە ﷻفەرموویەتی: ﴿ يَوْمَ لَا يَنفَعُ الظَّالِمِينَ مَعْذِرَتُهُمْ ۖ وَلَهُمُ اللَّعْنَةُ وَلَهُمْ سُوءُ الدَّارِ﴾ غَافِر: [٥٢]

واتە : ئەو ڕۆژە کە عوزر و بیانوو و پاڕانەوەی ستەمکاران و زاڵمان وەرناگیرێت و هیچ کەڵکێکیان پێ ناگەیەنێت ، لەعنەت و خراپترین حاڵ و جێگەیان بۆ هەیە لە دۆزەخدا.

**٢٣- قورئان دەخوێنمەوە بە مەبەستی ئەوەی کە قورئان ببێتە حوجە و بەڵگە بۆم ، نەك ببێتە بەڵگە و حوجە بەسەرمەوە** ، چونکە کەسی خوێنەر کە قورئان دەخوێنێتەوە گەر کار و کردەوەی بە قورئان کردبێت و لێی تێگەیشتبێت و لێی ورد بووبێتەوە و پێی ڕازی بووبێت و حەڵاڵەکانی بە حەڵاڵ زانیبێت و حەرامەکانی بە حەرام زانیبێت و بە حوکم و بەرنامەکەی ڕازی بووبێت ، ئەوا بەڕاستی ئەو کەسە سەرفراز دەبێت و لە قیامەتدا قورئان دەبێت بەڵگە و حوجە بۆی ، بەڵام گەر بەو پێچەوانە بوو ئەوە لە قیامەت دەبێتە بەڵگە لەسەری و ئەوا بەڕاستی خەسارەتمەند دەبێت و سزایەکی بە ئێش و سەختی چاوەڕێیەتی .

هەروەك پێشەوا موسلیم هێناویەتی: (والقرآنُ حُجَّةٌ لك أو عليك) رواه مسلم

واتە: ( قورئان حوجە و بەڵگەیە بۆت ، یان حوجە و بەڵگەیە لەسەرت).

هەروەها اللە ﷻفەرموویەتی: ﴿وَقِفُوهُمْ ۖ إِنَّهُم مَّسْئُولُونَ﴾ الصَّافات: [٢٤]

واتە : وە ڕایانگرن !چونکە بەڕاستی لە وتە و کردەوەکانیان بەر پرسیارن.





## ٢٤- قورئان دەخوێنمەوە و سەیری دەکەم لەسەر مصحف و بەرگەکەی ، چونکە سەیرکردنی مصحف ی قورئان عیبادەتە.

قال التابعي الإمام يونس بن عبيدﷺ : (كان خُلُقَ الأولين : النظرُ في المصحف)[١].

واتە : ڕەوشتی سەلەف - ماوەڵان : (سەیرکردنی قورئان بوو - خوێندنەوە لە مصحف دا).

قال الصحابي الجليل عبد الله بن مسعود رضي الله عنه: (أديموا النظر في المصحف)[٢].

واتە : بەردەوام سەیری قورئان بکەن و زۆر بیخوێننەوە.

قال الإمام محمد بن الحسين الآجري: ( وأحب أن يكثر القراءة في المصحف، لفضل من قرأ في المصحف)[٣].

واتە : پێم خۆشە زۆر لە مصحف دا قورئان بخوێنێم ، لەبەر پلە و پایەی ئەو کەسەی لە مصحفدا قورئان دەخوێنێت.

عن أبي خالد قال: ( صحبت السفيان الثوري في طريق مكة ، فكان يقرأ في المصحف كل يوم ، فإذا لم يقرأ فيه ؛ فتحه فنظر فيه وأطبقه)[٤].

واتە : أبي خالد فەرموویەتی : هاوەڵیەتی سوفیانی ثەوری م کرد لە ڕێگەی مەککە ، هەموو ڕۆژێك لە مصحف دا قورئانی دەیخوێند ، ئەگەر تیای نەخوێندایە ، قورئانەکەی دەکردەوە و سەیری دەکرد و پاشان دایدەخستەوە.

---

سەرچاوە: [١]( مصنف ابن أبي شيبة) [٨٥٦١]

سەرچاوە: [٢]( مصنف ابن أبي شيبة) [٨٦٤٦]

سەرچاوە: [٣]( أخلاق حملة القرآن)

سەرچاوە: [٤]( تقدمة الجرح والتعديل ).



## ٢٥- قورئان دەخوێنمەوە بە مەبەستی گەیشتن و بە دەست هێنانی خێر لەسەری و فەزڵ و گەورەیی لای الله.

الله ﷻفەرموویەتی: ﴿ ثُمَّ تَوَلَّيْتُم مِّن بَعْدِ ذَٰلِكَ ۖ فَلَوْلَا فَضْلُ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُ لَكُنتُم مِّنَ الْخَاسِرِينَ﴾ البَقَرَة:[٦٤]

واتە : کەچی دوای ئەو هەموو بەڵێن و پەیمانە ڕووتان وەرگێڕاو پشتتان لە ڕێبازی الله ﷻهەڵکرد و پەیمانەکەتان هەڵوەشاندەوە ، خۆ ئەگەر بەزەیی و فەزڵ و میهرەبانی الله ﷻنەبووایە لەسەرتان ، کە تەوبەی لێوەرگرتن لە دەستەی زیان لێکەوتوان و زەرەر مەندان دەبوون.

## ٢٦- قورئان دەخوێنمەوە بە مەبەستی ئەوەی بۆنم خۆش بێت بەو شێوازەی کە رسول الله ﷺباسی کردووە.

عَنْ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ رضى الله عنه، قَال : قَال رَسُولُ اللَّهِ ﷺ : (مَثَلُ الْمُؤْمِنِ الَّذِي يَقْرَأُ الْقُرْآنَ مَثَلِ الأُتْرُجَّةِ، رِيحُهَا طَيِّبٌ وَطَعْمُهَا طَيِّبٌ، وَمَثَلُ الْمُؤْمِنِ الَّذِي لَا يَقْرَأُ الْقُرْآنَ مَثَلِ التَّمْرَةِ، لَا رِيحَ لَهَا وَطَعْمُهَا حُلْوٌ، وَمَثَلُ الْمُنَافِقِ الَّذِي يَقْرَأُ الْقُرْآنَ مَثَلُ الرَّيْحَانَةِ، رِيحُهَا طَيِّبٌ وَطَعْمُهَا مُرٌّ، وَمَثَلُ الْمُنَافِقِ الَّذِي لَا يَقْرَأُ الْقُرْآنَ كَمَثَلِ الحَنْظَلَةِ، لَيْسَ لَهَا رِيحٌ وَطَعْمُهَا مُرٌّ). (رواه البخاري ٥٤٢٧ - ومسلم ٧٩٧)

واتە : ئەبو موسای ئەشعەری الله ﷻلێی رازی بێت دەفەرموێت : رسول الله ﷺفەرموویەتی: (نموونەی ئەو بڕوادارەی کە قورئان دەخوێنێت ، وەکو لیمۆ وایە ، بۆنی خۆشە و تامیشی خۆشە ، وە نموونەی ئەو بڕوادارەی کە قورئان ناخوێنێت ، وەکو خورما وایە ، بۆنی نیە و تامی شیرینە ، وە نموونەی ئەو دووڕوو و مونافیقەی کە قورئان دەخوێنێت وەکو ڕەیحانە وایە بۆنی خۆشە و تامی تاڵە ، وە نموونەی ئەو دووڕوو و مونافیقەی کە قورئان ناخوێنێت ، وەکو گوژاڵك وایە هیچ بۆنی نییە و تامیشی تاڵە).





## ٢٧- قورئان دەخوێنمەوە و شوێنی دەكەوم بە مەبەستی لابردنی دڵتەنگی و دڵتوندی و لابردنی خەم و ناڕەحەتیم.

الله ﷻفەرموویەتی: ﴿ قُلْنَا ٱهْبِطُواْ مِنْهَا جَمِيعًا فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّى هُدًى فَمَن تَبِعَ هُدَاىَ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ﴾ البقرة: [٣٨].

واتە : ئینجا وتمان هەمووتان دەبێت دابەزن بۆ سەر زەوی ، جا ئەگەر هەر كاتێك لە لایەن منەوە ڕێنومایيتان بۆ هات ، هەركەس شوێن ڕێنوومايی من بكەوێت ، ئەوە نە ترسیان لەسەر دەبێت ، نە غەمگین و دڵتەنگ دەبن.

هەروەها رسول الله ﷺفەرموویەتی: ( اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْهَمِّ وَالْحَزَنِ) .

واتە : یا الله پەنات پێدەگرم لە خەفەت و دڵتەنگی.

البخاري، كتاب الدعوات، باب التعوذ من غلبة الرجال، برقم ٦٣٦٣





## ٢٨- قورئان دەخوێنمەوە بە مەبەستی ئەوەی كە الله داواكاریەكانم بۆ جێبەجێ بكات و وڵامی دوعا و پاڕانەوەكانم بداتەوە و لە ڕیزی خۆ بەگەورەزانەكان نەبم.

الله ﷻفەرموویەتی: ﴿وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ ۚ إِنَّ الَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِي سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ﴾ غَافِر: [٦٠]

واتە : وە پەروەردگارتان فەرمووی : داوا لە من بكەن و لە من بپاڕێنەوە ، منیش وەڵامتان دەدەمەوە ، بێگومان ئەوانەی خۆیان بە گەورە دەزانن لە پەرستنم بە تاك و تەنها ، بێگومان بە سەر شۆڕیی و زەلیلی و بە بچووكی دەچنە دۆزەخەوە.

هەروەها الله ﷻفەرموویەتی: ﴿وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِى عَنِّى فَإِنِّى قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ ٱلدَّاعِ إِذَا دَعَانِ فَلْيَسْتَجِيبُواْ لِى وَلْيُؤْمِنُواْ بِى لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ﴾ البقرة [١٨٦].

واتە : ئەی محمد ﷺئەگەر بەندەكانم پرسیارت لێبكەن دەربارەم ، ئەوە من نزیكم لێیانەوە (بە علم و زانست چاودێرم بەسەریانەوە و لەگەڵیانم)، بە هانا و هاواری دوعا و پاڕانەوەیان دەچم هەر كاتێك لێم بپاڕێنەوە و نزا بكەن ، دەبا ئەوانیش بە دەم بانگەوازی منەوە بێن و باوەڕی دامەزراو بە من بهێنن ، بۆ ئەوەی ڕێگای هۆشیاری و بەئاگایی بگرنەبەر بۆ بەدەستهێنانی سەربەرزی و سەرفرازی و بەهەشت.

## ٢٩- قورئان دەخوێنمەوە بە مەبەستی ئەوەی كە قورئان دۆستم بێت لەناو گۆڕەكەمدا ، وە ببێت بە نور و ڕۆشنایی و ڕووناكی بۆم لەسەر پردی صراط.

## ٣٠- قورئان دەخوێنمەوە بە مەبەستی ئەوەی كە نەفسم خەریك بكەم بە حەق و وەرگرتنی حەق و سوود ، بۆ ئەوەی خۆم خەریك نەكەم بە باطل و شتی بێ سوود.





## ٣١- قورئان دەخوێنمەوە بە مەبەستی ئەوەی كە لەو كەسانە نەبم كە دوو ڕوو و مونافیقن كە ، كەم یاد و زیكری الله دەكەن.

الله ﷻفەرموویەتی: ﴿ إِنَّ الْمُنَافِقِينَ يُخَادِعُونَ اللَّهَ وَهُوَ خَادِعُهُمْ وَإِذَا قَامُوا إِلَى الصَّلَاةِ قَامُوا كُسَالَىٰ يُرَاءُونَ النَّاسَ وَلَا يَذْكُرُونَ اللَّهَ إِلَّا قَلِيلًا﴾ النِّسَاء: [١٤٢].

واتە : بەڕاستی دووڕووو و مونافیقەكان وا دەزانن فێڵ لە الله ﷻدەكەن ، كەچی الله ﷻخەڵەتێنەری ئەوانە هەر كاتێكیش هەستن بۆ نوێژ بە تەمبەڵی و سستی هەڵدەستن ڕوپامایی بۆ خەڵكی ئەكەن وە یادی الله ﷻناكەن تەنها كەمێك نەبێت.

أخْرَجَ ابْنُ جَرِيرٍ، وابْنُ الْمُنْذِرِ، عَنِ الحَسَنِ في الآيَةِ ﴿وهُوَ خادِعُهُمْ﴾ ، قالَ: ( يُلْقى عَلى كُلِّ مُؤْمِنٍ ومُنافِقٍ نُورٌ يَمْشُونَ بِهِ يَوْمَ القِيامَةِ، حَتّى إذا انْتَهَوْا إلى الصِّراطِ طُفِئَ نُورُ المُنافِقِينَ ومَضى المُؤْمِنُونَ بِنُورِهِمْ، فَتِلْكَ خَدِيعَةُ اللَّهِ إيّاهم)[١].

واتە : پێشەوا حەسەنؒ لە تەفسیری ئایەتی : ﴿وهو خادِعُهُمْ﴾ ، فەرموویەتی : هەموو باوەڕدار و مونافیق و دووڕوویەك ڕۆشناییەكی پێیە و پێی ئەدرێت ، ڕێی پێ دەكەن لە ڕۆژی قیامەتدا ، تاوەكو كۆتایی پێ دێت و تەواو دەبن لەسەر پردی صراط و نزیك دەبنەوە لە تەواو كردنی ڕێگاكە ، نوور و ڕووناكی مونافیقەكان دەكوژێتەوە و نوور و ڕووناكی بڕوادارانیش دەمێنێتەوە بە داگیرساوی ، ئا ئەوە پیلان و فێڵی الله یە بۆ ئەوان.



سەرچاوە: [١](الدر المنثور ، ئەو تەفسیرە لە پێشەوا سوودی و ابن المنذر و موجاهید و سعید بن جبیر و ابن جریج و غەیری ئاوانیشەوە هاتووە ، رحمهم الله تعالی ).



## ٣٢- قورئان دەخوێنمەوە بە مەبەستی ئەوەی کە لەو کەسانە نەبم کە هەڵگری بیر و فکری نەفامی و نەزانین ، هەروەها ڕاستی و ناڕاستی لە یەکتر جیا ناکەنەوە.

الله ﷻفەرموویەتی: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا كَافَّةً لِّلنَّاسِ بَشِيرًا وَنَذِيرًا وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ﴾ سَبَأ: [٢٨]

واتە : ئێمە هەر بۆیە تۆمان نارد ئەی محمد ﷺکە بۆ تەواوی خەڵکی جیهان ، ببیتە موژدەدەر و ترسێنەر ، بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن.

هەروەها الله ﷻفەرموویەتی: ﴿ خُذِ الْعَفْوَ وَأْمُرْ بِالْعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنِ الْجَاهِلِينَ ﴾ الأعرَاف: [١٩٩]

واتە : هەمووکات بۆ جێبەجێکردنی ئیش و کارەکانت ڕێگەی ئاسان بگرە بەر و عەفوو لێبوردنیش ڕەوشتت بێت و هەردەم فەرمان بە چاکە بدە و لە خەڵکانی نەفامیش ڕوو وەرگێڕە و لە ڕێگەی بانگەوازەوە بڕۆ و هەنگاو بنێ ،

واتە : پاش بەڵگە هێنانەوە بۆیان ، ئەگەر هەر سوور بوون لەسەر کاری نەفامی خۆیان ، پشتگوێیان بخە و بەکاری بانگەوازەوە خەریکبە.

## ٣٣- قورئان دەخوێنمەوە بە مەبەستی جەنگان لەگەڵ نەفسی تاو انکاری خۆم و شیطان و هەوا و حەز و ئارەزووەکانم.

الله ﷻفەرموویەتی: ﴿وَمَا أُبَرِّئُ نَفْسِي ۚ إِنَّ النَّفْسَ لَأَمَّارَةٌ بِالسُّوءِ إِلَّا مَا رَحِمَ رَبِّي ۚ إِنَّ رَبِّي غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ يُوسُف [٥٣]

واتە : هەرگیز پاکانە بۆخۆم ناکەم ، چونکە نەفس و دەروون هەمیشە فەرمان بە خراپە دەدات ، مەگەر کەسێك الله ﷻخۆی ڕەحمی پێبکات و بیپارێزێت ، بەڕاستی پەروەردگارم زۆر لێبوردەیە بۆ هەڵە و تاوانەکان ، زۆریش میهرەبانە ، بەرامبەر بە تەوبەکاران.





هەروەها الله ﷻفەرموویەتی: ﴿ وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِ وَنَهَى النَّفْسَ عَنِ الْهَوَىٰ ﴾ النّازِعات [٤٠]

واتە : بەڵام ئەو کەسەی لە گەورەیی و دەسەڵاتی پەروەردگاری خۆی ترسابێت و جڵەوی نەفسی لە هەوا و ئارەزوو گرتبێتەوە.

## ٣٤- قورئان دەخوێنمەوە بە مەبەستی ئەوەی کە الله لە نێوان من و لە نێوان کافر و موشریك و بێباوەڕان حیجاب و پەردەیەکی داپۆشەر دابنێت.

الله ﷻفەرموویەتی: ﴿ وَإِذَا قَرَأْتَ الْقُرْآنَ جَعَلْنَا بَيْنَكَ وَبَيْنَ الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ حِجَابًا مَّسْتُورًا ﴾ الإسْرَاء [٤٥]

واتە : هەر کە تۆ قورئانیان بەسەردا دەخوێنیت - لەبەر لاساریی و نەگریسی خۆیان - ئێمە لە نێوان تۆ و ئەوانەدا کە باوەڕیان بە قیامەت نییە ، پەردەیەکی نادیار و داپۆشراو دادەنێین.



**لە کۆتاییدا ئەڵێم :** هەرچی سوپاس و ستایشە جێگیری دەکەم بۆ اللّٰه کە پەروەردگاری جیهانیانە و داواکارم لە اللّٰه ﷻلێمان قبوڵ بکات و لەسەر ئیسلام و سوننەت بمانژیەنێت و بمانمرێنێت و هیدایەت و تەوفیقمان بدات ، آمین..

الحمد لله الذي بنعمته تتم الصالحات ، والحمد الله على توفيقه وفضله وصلى الله على محمد وعلى آله وصحبه الى يوم الدين.